# پێشەکی

سەرەتا سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە بۆ هەموو نیعمەتێکی کە توانیم دوای ماندووبوونێکی زۆر و هەوڵدانێکی زۆر ئەم کتێبە تەواو بکەم و لەو بوارەی کە خۆم لێوەی شارەزام و هەموو خەون ئامانجمە توانیم کتێبک بنووسم ،، ئەم کتێبە پێکهاتووە لە کۆمەڵێ قسە و وتەی ئیلهام بەخش و هیوا بەخش کە ئامانج لێی سوود گەیاندنە بە خوێنەران ،، هیوام سەرکەوتنی گشت لایەکە و بمێنن...

زریان زرار

24 / 3 / 2020

سێشەممە

...................................

# وەکو مندال بە...!!

تا ئێستا منداڵێکت بینیووە کاتێ کە سەرەتایە و دەیەوێ پێ بگرێ بەڵام هەر دەکەوێ ئەها سەرنجت داوە هەڵدەستێتەوە و دووبارە دەکەوێ هەڵدەستێتەوە و دەکەوێ ئەم کردارە چەندین جار دووبارە دەکاتەوە ، وەلێ سەیرت کردووە گوێ بە قسەی چواردەورەکەی نادات پێی دەڵێن دانیشە دەکەوی ،، ناتوانی ،، بەڵام ئایا گوێ دەگرێ ؟ بێ گومان نەخێر ئەمجارە بە خەندەیەکەوە هەڵدەسێتەوە و ڕێدەکات ،، دە ئیدی تۆش ئاوابە لە بەرامبەر هەموو کێشەکانت ،، شکستەکانت ،، ئازارەکانت ،، خەندەیەک بکە ،، خۆ مەگەر قەرارە بە دڵتەنگبوونی تۆکێشەکە چارە دەبێ ؟ نا نەخێر خەندەیەک بکە و بڵێ ئەمە شکست نیە بەڵکو دەرفەتێکە دووبارە پێداچوونەوە بە خودی خۆما بکەم بزانم لە چیدا هەڵەم تاکو ڕاستی بکەمەوە ،، گەر هاتبا منداڵەکەش وەک ئێمە بیریکردبایەوە کە لە ترسی قسەی خەڵک لە هەوڵدان بوەستێ ئەوا کەسمان ئێستا پێمان نەدەگرت ،، بۆیە دەستێبکەوە و هەنگاو هەڵگرە......

# سەرکەوتن نابەخشرێ....!

دەمەوێ ئەو کەس بیت دەبووە بەو شێوە بویتایە

مەهێڵە کەس کارت تێبکات ، ڕێگە بەکەس مەدە پێت بڵێ کە دەرگاکان بەڕووتدا داخراوە ، هەرگیز ڕێگە بە کەس مەدە پێت بڵێ کە هیچ دەرفەتێ نیە ، ،دەبێ ئەو کەسە بیت کە دەبوو بەو شێوە بویتایە

چونکە کاتێ دەبیتە ئەو کەسە توانایەکی لە ڕادەبەدەرت دەبێ ، گوێم لێبگرە ژیان ترسیشی پێ بەخشیوی و بڕوا بوونیشی پێ بەخشیوی

ئەگەر بڕیارتدا بە ڕێگای ترسدا نەڕۆی هەمیشە بڕوا بەخۆبوون هەڵبژێری ئەوا بزانە دەنگی ئەو شکۆمەندیەیە کە لە ناختدا هەیە گوێت لێمە ئەو شکۆمەندیەی لە ناختدا بەڵام کێشەکەی تۆ ترسە دەترسی دەست پێکە بکەی ،، هەمووشتەکان بە ئاسانی نایەتە پێشەوە هەموو شتەکان بەدڵی تۆ نابێ دەبێ خۆت ئامادەکەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە سەرکەوتن نابەخشرێ بەڵکو بەدەست دەهنێرێ دەمەوێ بەدەستی بێنی...!

# تۆ مەزنی....!!

دەتەوێ پاشەکشە بکەیت دوای چی ؟ دوای ئەوەی نیوەی
ڕێگاکەت بڕیوە و دەتەوێ وازبێنی دەبوایە لە سەرەتاوە وازتهێنابا
سەیرکە سەیرکە ڕێگای سەرکەوتن ڕێگای کەسە
مەزنەکانە کەسە بچووکەکان ناتوانن ئەو ڕێگایە بگرنە بەر
دەزانی جیاوازی تۆ و کەسانی تر چیە تۆ بەهێزی تۆ مەزنی ،، تۆ
باشترینی ،، تۆ بەرەوپێش هەنگاو هەڵدەگریت ،، لە بەرامبەر
هیچ ئاستەنگێکدا ڕاوەناستی هەردەم لە بەرەوپێچوونی خودی
خۆتی ئارام بگرە ئارام بگرە ڕێگای سەرکەوتن هەروا ئاسان
نیە گەر ئاسان بوایە هەموو کەسێ دەیتوانی پێیبگات تۆ
باوەڕت بەتواناکانی خۆت هەیە کە دەتوانی شتێک بگۆڕی .....

بەردەوام بە تا سەردەکەوی.......!

# جیاواز بــه.....!!

تۆ هەمیشە جیاواز بە هەمیشە جیاواز بیرکەرەوە هەمیشە جیاواز بڕوانە جیاواز پلان دانێ وەک کەسانی تر مەبە مەهێڵە کەس کارت تێبکات بەبیر و باوەڕی کەس مەژی ئەوە بکە خۆت دەتەوێ ،، واز لە قسە نەرێنیەکانی خەڵک بێنە گرنگی بەخۆت بدە ،، گرنگی بە تواناکەت بدە ،، گرنگی بەو کەسانە بدە کە هانی تۆ دەدەن ،، پاڵپشتی تۆ دەکەن ،، پشتگیری کارەکانی تۆ دەکەن ،، ئەو کاتەی تۆ گرنگیت بەخۆت و بەو جۆرە کەسانەدا ئەوا دەبیتە خۆشبەختترین مرۆڤی سەرزەوی.....!!

# ئەوە بکە کە خۆت دەتەوێ....!!

تۆ بۆخۆت بژیت چیت پێخۆشە وابکە سەیرکە سەیرکە هاوڕێ
قەرار نیە هەموو کەس ئێمەی خۆش بووێت چونکە نابێت

قەرار نیە هەموو کەس لە ئێمە ڕازی بێت چونکە نابێت بۆیە
چیت پێخۆشە بیکە تۆ وانەکەت ئامانجەکەت هەر کارێک لە
ژیانیت بیکەت لەبەر خۆتی دەکەی یان لەبەر قسەی خەڵک
ئافەرم لەبەر خۆتی دەکەی با قسە پڕوپوچەکانی خەڵکی
بۆخۆیان بێت نرخ بۆ قسەکانیان دامەنێ تۆ بەرەوپێش هەنگاو
هەڵگرە و بەرەوپێش بڕۆ تا سەرکەوی

سەیرکە سەیرکە هەرکارێک بکە هەر کارێک بەڵێ
کۆمەڵێ گەمژە هەن قسەت لەسەر دەکەن هەرکارێک کە
بیکەی ،، بۆیە ئەوە بکە کە خۆت دەتەوێ...

## زەردەخەنە....!!

تۆ کاتێک ئەم نوسینە دەخوێنیتەوە

نازانم دڵخۆشی یان دڵتەنگی!

بەڵام دەمەوێ پێت بڵێم تۆ شایەنی دڵخۆشبونی دەمەوێ پێت بڵێم تۆ جوانتر و بەهێزتری لەوەی بیری لێ دەکەیتەوە تۆ هەریەکێکی لەو کەسانەی کە دەتوانی ژیانی خۆت و کەسانی تریش جوانتر بکەیت تۆ دەتوانی بگەیت بە خەونەکانت و دەتوانیت ببیتە خەونی زۆر کەسی تر...

من دڵخۆش دەبم ئەگەر ئێستا تۆ زەردەخەنەیەک بکەیت و بڵێ بەڵێ من هەر ئەو مرۆڤەم کە دەتوانم زۆر شت باشتر بکەم.....

# هەنێ کات....!!!

هەنێ کات ،، تۆ هەست دەکەیت کە ناتوانیت بەردەوام بیت...

هەست دەکەی کە زۆر تەنهایت و وون بوویت...

هەمووی ئەوەی دەیبینی شەوە ،، وە تاریکیش لە هەموو لایەکە...

زۆر هەست بە بێ توانایی دەکەیت ،، وە ناتوانی ببینی بۆ کام ڕێگا دەبێ بڕۆی...

نائومێد مەبە ،، هەرگیز هیوا لە دەست مەدە...

چونکە خودا هەمیشە لەلاتە.....!!!

هەنێ کات ،، کە هەڵەیەک دەکەیت...

تۆ وا هەست دەکەی کە ناتوانی تەوبە بکەیت وە کات زۆر درەنگی کردووە..

تۆ زۆر شڵەژاوی....

بڕیاری هەڵەت داوە...

بەدوای مێشکت دەکەوی ،، وە دڵت پـــڕە لە شەرم...

بەڵام نا ئومێد مەبە ،، وە هیـوا لە دەست مەدە...

چونکە خودا هەمیشە لەلاتە....!!!!

# لوتكه...!!

وەلێ دەبێ ئەوە بزانن گەیشتن بە لووتکە ئاوا ئاسان نیە وە پارێزگاریکردن و مانەوە لە لوتەکەیا لێی گرنگە و زەحمەتە

هیچ شتێ لە ژیان تا سەر نیە هەموو شتێ قۆناغ بە قۆناغە ...

ئەمرۆکە کە لە ترۆپکی ئاستی خۆتیت لەسەرت واجبە !! کە دەبێ مێژوویەکی نەمر و زێڕین بۆخۆت بنووسیەوە ئەم توانا و ئاستە بەرزەی هەتە بە دەرفەتێ بزانی و بە بوغرایی و لووت بەرزی بەرەو فەنابوونی نەبەیت....

# ئـایفۆن....!!!

بێهنه پێش چاوت ،، ئەگەر ستیف جۆبز بترسابا لەوەی خەڵکی قسه پێ دەڵێن ،، خەڵک بەرهەمەکانی ئەویان بەدڵ نابێ ،، بێهنه پێش چاوت ستیف بترسابا له هەوڵدان ،، بترسابا لەوەی کاتێ شکست بهێنێ خەڵک چۆن له ئەو دەڕوانن...

ئەوا ئەوکاته تۆ ئەو ئایفۆنەت نەدەبوو که ئێستا کاری پێدەکەی

هاوڕێ گوێ به قسەی خەڵکی مەدە گەر ئێمه تەنیا کەمێ تەنیا کەمێ ،، کاتی خۆمان بۆ بەرەوپێشبردنی خودی خۆمان و توانا و بەهرەکانی خۆمان تەرخان بکەین و گرنگی بەخۆمان بدەین ئەوا ئێمه خۆشبەخت دەبین  لەوەی ئێمه کاتی خۆمان بەوە بەفیرۆ بدەین فلان وای گوت ،، کەواته ئەمه له خۆت بپرسه دەتەوێ ببیته کەسێکی شکستخواردوو یان کەسێکی سەرکەوتوو ئەوە خۆتی بڕیار دەدەی ببیته کامیان....

# شانازیـت پێوەدەکەم.....!!

من شانازیت پێوە دەکەم ،، کە تا ئەم دەقەیەش کۆڵت نەداوە...

من شانازیت پێوە دەکەم ،، کە قسە ڕووخێنەرکانی خەڵکی ساردی نەکردیەوە.

من شانازیت پێوە دەکەم ،، کە لەگەڵ ئەوپەڕی زۆری کێشەکانت زۆری ئازار و ناڕەحەتیەکانت بەڵام تۆ هەر بەردەوام بوویت لەسەر ڕێگاکەت...

من شانازیت پێوە دەکەم ،، کاتێ کەوتی ،، کاتێ شکستت هێنا بەڵام تۆ هەر بەهێز بووی ،، هەر بەهێزی بووی لە ووتنی : بەڵێ من دەتوانم...

من زۆۆر  شانازیت پێوە دەکــەم...

# جێگایی نووستن......!!

ئەگەر دەتەوێ جیهان بگۆڕی ، ئەگەر دەتەوێ شتێک بگۆڕی ئەوا سەرەتا لە خۆت دەستپێبکە گەر تۆ نەتوانی جێگای نوستنەکەت ، ژورەکەت ، مێزەکەت ، کەلوپەل ، جلوبەرگەکانت ڕێکبەخەی ئەی چۆن دەتوانی جیهان بگۆڕی ئەی چۆن دەتەوێ شتێک بگۆڕی ئەها هاوڕێ باش بزانە شتە سادەکان کاریگەریان هەیە لەسەرمان گەر تۆ نەتوانی شتە سادەکان ئەنجام بدەیت ئەوا ناشتوانی شتە گەورەکان لە ژیاندا ئەنجام بدەیت.....

# هەڵەکردن....!!!

ئێمە دەبێ لە جیاتی ئەوەی خۆمان سەرزەنشت بکەین دەبێ پەند لە هەڵەکان وەربگرین ،، وەلێ گەر وا نەکەین لە داهاتوودا ئەم هەڵانە دووپاتدەکەینەوە..

کاتێ گەشەکانتان بۆ ماوەیەکی کاتی دەوەستێ ،، ئەوا بزانن کە هیچ شتێکت لە گۆڕێدا بوونی نیە ،، نەخێر تۆ شکستت نەهێناوە بەڵکو ئەمە دەکرێ وەک ئەزموونێ وەریگری تاوەکو لە ئانیدەدا دووپاتی نەکەیەوە...

" ئانتۆنیۆ ڕۆبێنز "

# ترس.....!!

دەزانیت مەزنترین داوی سەر ڕێگەی سەرکەوتنت چییە

ئەوەی بەربەستە کە خەڵکی نەتوانن بگەنە مەبەست و هەوڵەکانیان ،، ئەویش ترسە لە شکست ، ترس لە دەکران ، ترس لە ئازار ، ترس لە سەرکەوتن ، ترس لە هەموو نەزانراوەکان بۆئەوەی ئەو ترسە سنوورداربکەیت پێویستە ڕووبەڕووی بوەستیتەوە شاڵاوی بۆ بەریت ، تۆ دەتوانی هەر ئێستا بگۆڕێیت بۆ ئەو کەسەی کە خەونی پێوە دەبینی دەی بڕیار بدە و دەست پێبکە ، تۆ کەسێکی بێ وێنەی وزەیەکی گەورە لە تۆدا هەیە بەکاری بخە ،، لەوانەیە ڕۆژێ ژیانی تۆ بکەمە سەرمەشق بۆخۆم و بۆ کەسانی تریشی باس بکەم ،، بڵێم کە تۆ چەندە بەهێزی چەندە بەتوانای...!!

" ئانتۆنیۆ ڕۆبێنز "

# تۆ کێی....!؟

تۆ هەر کێیەکی کە ئێستا ئەمە دەخوێنیتەوە سڵاوت لێبێ

بەدڵنیاییەوە خودا دەیەوێ کە باشبیت

منیش ئومێدەوارم کە تۆ بەزییەکت بەخۆتا بێتەوە و

هەموو خەمەکانت بەلابنێی و زمردەخەنە لەیاد نەکەی چونکە

دەزانم ئارامی ڕوحت لەدەست خۆتدایە تەنها خۆت.....

# هێزی متمانه بەخۆبوون.....!

هەموو مرۆڤێک بە جۆرێک لە جۆران متمانەی بەخۆی هەیە دەبینیت کەسی متمانە بەخۆبوو لـەگەڵ خەڵکی یاخود لەگەڵ هاوسەرەکەی یاخود منداڵەکانیدا دەدوێت کەواتە هەموو یەکێک لە ئێمە متمانەی بەشتێکی دیاریکراو هـەیە

ئەوکەسەی کە دەڵێت من هیچ متمانەیەکم بەخۆم نیە

قسەکەی دروست نـیە بەڵکو ئەو تەنها بێ متمانەیە بەخۆی پاشان دەستیکردووەتە گشتاندنی ئەو بێ متمانەییە تا کار گەیشتۆتە ئەوەی بڵێت : من متمانەم بەخۆم نــیە

د.ایبـراهیم فەقێ دەڵێ

جارێکیان لە یەکێک لە کۆنگرەکاندا لە شاری قاهیرەی میسر پیاوێک هات بۆ لام تەمەنی ٧٠ ساڵ دەبوو ،، پێی گوتم لە مێژە بەهیوای ئەوەم دکتۆرا بێنم ،، گوتم لە چ بوارێک گوتی گرنیگ نیە لە چ بوارێکدا ،، گرنگ ئەوەیە من بەئاواتی ئەوەوەم کە دکتۆرام هەبێ بەڵام چوومەتە ساڵەوە و لە تەمەنی خوێندن نەماوم ،، پێموت تەمەنت چەندە گوتی ٧٠ گوتم ئەوە ماوەیە چەندە کە دەبێ بۆ دکتۆرا بخوێنی گوتی ٤ ساڵ گوتم ئەدی لە پاش ٤ ساڵی تر تەمەنت دەبێ بە چەند ؟ گوتی ٧٤ ساڵ ئینجا گوتم ئەدی ئەگەر دکتۆرات هێنا ئەو دەم دەبی بە چەند گوتی ٧٤ ساڵ گوتم ئەی ئەگەر بۆ دکتۆرا

نەتخوێند دەبی بە چەند گوتی ٧٤ ساڵ گوتم کەواتە بخوێنە بۆ دکتۆرا ، پاش چەند ساڵێک هەمان پیاوم بینیەوە و گوتی دکتۆرام بەدەستهێنا ،، ئەو وای هەست دەکرد بەوەی کە تەمەنی گەیشتۆتە ٧٠ ساڵ ئیدی زۆر ناژی ، هەربۆیە هەموو کات و ساتێکی ژیانی بەوجۆرە بەسەر دەبرد وەک ئەوەی دواهەمین ساتی بێت لە ژیانیداو بەم هۆیەشەوە لە چاوەڕوانی ژیانی بەسەر دەبرد....

# تۆ كەسێكی گرنگی....!!!!

هۆكاری زۆر هەن بۆ بوون لەسەر ئەم هەسارەیە، بەڵام من پێم وایە هۆكاری بوونتان لێرەدا ئەوەیە كە تۆ كەسێكی گرنگیت، ئەگینا لێرە نەدەبوویت، دەمەوێ بیر لەم بابەتە بكەیتەوە

تۆ هەیت، تۆ كەسێكی گرنگیت، چونكە زاتێك بیری لە پلانێك كردووەتەوە بۆت، ئەگینا نەدەبوویت، حاشا هەرگیز خودا كاتی بەفیڕۆ نادات، بەڕاستی گرنگە كە تۆ لەبەر هەر هۆكارێك بێ، بزانیت ئەوەندە گرنگیت كە دەبێ خۆشی لە ژیانت وەربگریت و خۆشی بەوانیتریش ببەخشیت و گۆڕانكاری تیادا بهێنیتە كایەوە، بەڵام نازانم چۆن چۆنی؟

بۆ ئەمە خۆتان بڕیار بدەن....

" ئانتۆنیۆ ڕۆبێنز "

# خەون.....!

خــەون بە سەرکەوتن مەبیـــنە

بەڵــکو هــەوڵــی بــۆ بــدە....

# سروشت.....!!

سروشت كە بەردەوام مرۆڤ تێك دەشكێنێ ،، بەڵام ئامانج و ئەركی مرۆڤەكەشە دووبارە هەڵسێتەوە و بە ورەیەكی زیاترەوە بەرەو ئامانجەكەی هەنگاو هەڵگرێت...

دەكرێ تۆ ناوێ نێی ئامانج ، من پێی دەڵێم ململانێی ژیان ،، چون هەر لە بنەڕەتەوە ژیان بەرز و نزمی و ململانێییەك بووە ،، كە زۆر كات ململانێكە لە

ناخی مرۆڤا دەكات لێرەدا گرنگ نییە ئەم كێبڕكێیە چۆن كۆتایی یەت.. چون سبەی نەزانراوە و هەمووی ئەوەی تییدا دەژین ئێستەیە...

هەر بۆیەش گرنگ بەدەستهێنانیەتی ...

خۆشی لە خودی ئامانجەكدا نیە ،، بەڵكو لە پرۆسەی گەیشتن بە ئامانجەكەدایە.....

" ئێرنێست هێمنگوای "

# سەرکەوتن کاری یەک ڕۆژ نیـە.....!!!!

ئامانـج

پـلان

بەرنامە

جێبەجێکردن

# سەرکەوتن چییە ؟

زۆربەی زۆۆری رۆشنبیر و راگەیاندکار و هەتا دایکان و باوکان ومامۆستایانی خۆشەویست وەک پێویست پرسی سەرکەوتنیان نەخستۆتە روو ، بەڵکو گەنج و لاو و ئەو کەسانەی تازە پێدەگەن وەهایان تێگەیاندووە کە تەنیا فقد سەرکەوتن پەیوەستە یان بەندە بە پارە ، سامان ، ناوبانگ ، ..هتد

بەداخەوە لە جیات ئەوەی ئەمان ببنە هاندرێک بۆئەوەی هانی گەنجان و لاوان بدەن بەرەپێش بچن کتێبیان لا خۆشەویست بێت خۆیان بناسن بەلام بە پێچەوانەوە دەیان روخێنن چەندە جوانە گەنجانی ولاتەکەم هاورێ و دۆستی کتێب بن لە جیاتی ئەوەی هاورێ و دۆستی گازینۆ و نێرگلە و شتانی بێ سوود بن...

ولات و کۆمەڵگا بەەوە بەرەوپێش دەچێ بە گەنج و لاو بەلام چ جۆرە گەنج و لاوێک : ئامانجێکی هەبێ خەونێکی هەبێ توانای هەبێ کە دەتوانێ شتێک بکات توانای ئەوەی هەبێ داهێنانێک بکات توانای بەرێوەبردنی هەبێت توانای بەرپرسیارێتی هەبێت بەس زۆرینەی گەنجی ئێستا وانین گەنجێک فقد کاتە زێرینەکانی خۆی بەەوە بەسەر ببات چۆن بەناوبانگ بێت لە تیک تۆک یان سناپ چات ئەی بەتەمای ئەو گەنجە بین کۆمەڵگاو ولات بەرەوپێش ببات ..؟

گەنجی ئێستا هێندە خەریکی شتانێکی بێمانان خۆیان تەرخان بکەن بۆ بەرەوپێشبردنی خودی خۆیان دوایش بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگا و ولاتەکەیان دە قات باشترە لەوەی خۆیان بە شتانێکی پرووپووچ سەرقاڵ بکەن...

سەرکەوتن لە خودی کەوتنەوە هاتووە

سەر + کەوتن

# سەرکەوتن......!!

پێم وانیە هۆشیاری خەڵک بە گرنگی و بایەخی سەرکەوتن گەیشتبێتە ئاستێکی پێویست ،، زۆرینەی خەڵکی هێشتاکە هەر بەتەواویی لە چەمکەکانی سەرکەوتن تێنەگەیشتوون بگرە ئەوەی ناوی سەرکەوتن بێت لە بەرنامەی ژیانیدا بەو شێوەی کە پێویستە ببێت بوونی نیە بەداخەوە زۆربەی زۆری ئەو کەسانەشی بەدەر لە نەخوێندەواران ئەوانەی خوێندەوارن ناخوێننەوە ،، زۆربەی

ئەوانەشی کە دەخوێننەوە گرنگی بە سەرکەوتن نادەن....

" عبدالکریم البکار "

## خۆناسین....

مەترسیدارترین جۆرەکانی نەفامیی و نەزانیی

ئەوەیە کە مرۆڤ خودی خۆی نەناسێت....!!

# تاك.....!!!!

تاك خۆی دەستپێكە ،، بۆ بوون و بەخۆداچوونەوە ، چون دواتر
لە ناو كۆمەڵگەكەیدا ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت هەر بۆیە
بیرمەندی گەورە كۆمەڵگەكەی بەرەوپێش دەبات و بەرەو
لوتكەی دەبات وە كۆمەڵگەی بەهێزیش دیسان كەش و
هەوای لەبار بۆ تاكەكانی دەڕەخسێ و هانیان دەدات بۆ باشتر
بوون بەرەوپێش چوون

# من باشترین کەسم.....!!

مـن باشترین کەسم و بڕوام وایە کە

دەتوانم گۆڕانکاریەک دروست بکەم..!

بەڵێ بەڵێ تۆ کاتێ ئەم نووسینە دەخوێنیتەوە تۆ باشترینی تۆ

مەزنی تۆ دەتوانی گۆڕانکاریەک دروست بکە لەبەر ئەوەی تۆ

باشترینی ....!!!

# هاوڕێ......!!

هاوڕێ لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان ژیانی تۆ بکەم بە سەرمەشق بۆخۆم بۆ کەسانی تریشی باسکەم کە تۆ چەندە مەزنی چەندە بەهێزی ،، بۆیە لە هەوڵدان مەوەستە ،، بەردەوام بە بەردەوام بە بەردەوام بە تا سەردەکەوی تۆ بەهێزی هێزێکی گەورە لە ناخی تۆدا هەیە...

## به ئاگابه ...!!

سەیرێکی چواردەورت بکە....

ئەم شتە سەرسوڕهێنەرانە نابینی....؟

کە لەبەر دەستت دانراون....

هەورەکان لە ئاسمانەوە مەڵەدەکەن....

ئاسمانەکان ڕوون و شینن....

هەسارەکان لە خولگەکانیان....

مانگ و خۆر....

چەن جوان ڕێکخراون...

با پرسیار لە خۆمان بکەین....

ئەم شتانە بەس نین بۆمان...؟

یــان ئێمە زۆر کوێرین....!

کە گوێ بە هیچیان نادەین...

نــــەخـــێـــر....!

تەنها پێویســـتە

# متمانەبەخۆبوون....!!!!

متمانەبەخۆبوون و کارکردن بەباشی

باشترین چارەسەرە بۆ نەخۆشیەک کە پێی دەوترێت شکست

ئەوانە دەتکاتە کەسێکی سەرکەوتوو

# خەون.....

خەونەکانت بەرواری بەسەرچوونیان نیە..

هەناسـەیەکی قووڵ هەڵمـژە  وە

دووبـارە هەوڵ بەرەوە.....

# هیــوا....!!

هەرچەندە ئەگەر ڕێگریش هەبن

هیواکان نامــرنـ

لەهەر ئان و ساتێکیش بێت هەر دەردەکەون

# تۆ....

تۆ هەمیشە ئاسوودە بە قەینا با لێت تێنەگەنی یان بگۆڕێن ، یان لێت دوربکەونەوە ،، یان سزات بدەنگ گرنگیەکە ئەوەیە...

لەگەڵیانا ڕاست و باش بویت...!

لە سروشتی خۆتبە...!

ڕۆژێ دێ تێدەگەن کەس وەکو تۆ بۆیان باش نیە....!

ئەوکاتە هەست بەباشیت دەکەن ،، هەست بە گرنگیت دەکەن....!

# وشەکان....!!!

قسەیەک خراپ بوو مەیکە بەڵام قسەیەک باش بوو دەبێ بیکەی

" د.زانا احمد قساب "

یانی گەر تۆ قسەیەکی باش نازانی بکەی نازانیت دوو قسەی هاندەر بکەیت بۆ بەرامبەرەکەت ئێ دەکەوایە تۆش قسەی خراپ و نەرێنیی مەکە گەر ناتوانی هانی بدەی بێ هیوای مەکە ،، ئەوە بزانە وشەکان کاریگەری زۆریان هەیە ،، وشەکان دەتوانن کەسێ لەو پەڕی بێ هومێدی و بێ هیوایدا بیانخەنە سەرەوە ،، وە هەر دەتوانی بە وشەکانت کەسێ بێ هیوا بکەیت لە گەیشتن بە ئامانجەکانی بۆیە تکایە ئاگاداری وشەکانتان بن هانی خەڵک بدەن پاڵپشتی کەسانی گەنج و لاو بکە بڕوا بکەن هیچی تێناچێ گەر قسیەکی باش بکەیت ....!!

# ویست......

دەمەوێ بڵێم ویستن گرنگ نیە گرنگ نیە بریارە ئێمە چی بکەین ،، گرنگیەکە ئەوەیە تۆ خەریکی چیت ،، ئەها ئەمە گرنگە هەندێ کەسن هەن بیری جوان و ویستی بەرز و جوانیان هەیە ،، نموونە وەک ئەو قوتابیەی دەیەوێ بگاتە ئاستێکی بەرز کەچی ڕۆژانە ٢ سەعات دەخوێنێ و پلان دانانێ و هیچ نەکات ئێ کەوایە ناگاتە ئەو شتەی کە دەیەوێ ،، سەیرکە هاوڕێ ئەمە باش بزانە ئێمە نابینە ئەوەی کە بەردەوام بیری لێ دەکەینەوە ئێمە دەبینە ئەو کەسەی کە بەردەوام دووبارەی دەکەینەوە تۆ ڕۆژانە چی دووبارە دەکەیتەوە لە ژیانت ئەوا دەبیت بەوە کەوایە کردار گرنگترە لە ویست....!!

# ڕێگای سەرکەوتن.....

هاوڕێ ئەگەر تۆ وابیردەکەیەوە کە ڕێگای سەرکەوتن زۆر ئاسانە و فەرشی سوورە بۆت ڕاخراوە ،، ئەوا با من شتێکت پێ بڵێم ڕێگای سەرکەوتن ئاوا نیە کە تۆ بیری لێدەکەیەوە

هەمیشە گەیشتن بە لوتکە کاری قورس و سەختی دەوێ و هەوڵدانی بەردەوامی دەوێ ئەها بیرت بێت ،، ئەوانەی ڕێگایی سەرکەوتن دەگرنە بەر کەسانی مەزنن ،، چون ڕێگای سەرکەوتن ڕێگایەکی دژوارە و کەسە بچوووکەکان ناتوانن بەرگەی ئەو ڕێگایە بگرن و لە نیوەی ڕێگاکە کۆڵدەدەن و واز دەهێنن ،، بەڵام تۆ بەهێزی تۆ مەزنی و ڕێگاکەت هەر چەندێ دژوار و سەخت بێت تۆ زیاتر و زیاتر هەنگاو دەنێی بەرەوپێشەوە......!!!

# ئازایەتی دەوێ....!!!

مرۆڤەکان کاتێ هەست بە باشی دەکەن  کە قەرزەکانیان داوەتەوە و پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی باشیان هەیە ،، سەرکەوتوون لە تاقیکردنەوەکانیان ،، لە کارەکانیان ،، هتد

بەڵام سەرکێشی ڕاستەقینە لە ڕووی هەست و سۆز و بیرکردنەوە ئەو کاتە دەست پێ ئەکات کە تۆ شکست بێنی ،، ئازایەتی دەوێ کە بەرەنگاری ببیەوە ،، ئازایەتی دەوێ کە دووبارە دەست پێبکەیەوە ،، ئازایەتی دەوێ کە بڵێی هەموو شتەکان باشن مەحاڵ بوونی نیە ،، شتێک بە ناوی ئەستەم لە گۆڕێدا نیە ،، ئازایەتی دەوێ کە دووبارە بە گوڕتینەوە  دەستپێبکەیەوە.....

# شکست.....

ئەگەر شکستت هێنا لە کارێدا

هەرگیز هەرگیز کۆڵمەدە

چونکە شکست یەکەم هەوڵی

فێربوونە.....!!

# مەحــاڵ......

ئەوە بزانە کە مــەحــاڵ تەنیـا شتێکی هیچە
لەلایەن کەسە بچووکەکانەوە
بەکاردەهێنرێت....!!

# سەرکەوتن و شکست.....

یەک ڕێگە هەیە بۆ شکست..

بەڵام دەیان ڕێگە هەیە بۆسەرکەوتن..

" م.شکور سلێمان ڕاهێنەری گەشەپێدانی مرۆیی "

# فێربوون........

لەبارەی فێربوونەوە گوتویانە..

ئەوەی تەنیا گوێ دەگرێت، تەنیا سەدا سی سوود لە زانیارییەکان دەبینێت.

ئەوەی گوێ دەگرێت و زانیارییەکان تۆمار دەکات سەدا پەنجا سوود لە زانیارییەکان دەبینێت.

بەڵام ئەوەی گوێ دەگرێت و زانیارییەکان دەنووسێتەوەو پراکتیزەیان دەکات نزیکەی سەدا هەشتا هەتا سەدا نەوت سوود لە زانیارییەکان دەبینێت.

بۆیە تۆ تەنیا گوێ مەگرە، بنووسەوە، لەگەڵ زانیارییەکان کارلێك دروست بکە و پرکتیزەیان بکە، ئەوەیە رەفتاری کەسە سەرکەوتووەکان و کاریگەرییان بەسەر خودی خۆیان و کەسانی دیکەدا.

" م. شکور سلێمان ڕاهێنەی گەشەپێدانی مرۆیی "

# تۆ هەڵەی......!!!

مرۆڤ هەموو کاتێ نابێ خۆی بە ڕاست دابنێ ،، واتە تۆ کاتێ هەڵەیەک دەکەیت یان هەڵەیەکت هەیە ،، دانیپێدابنێ نەک هەر مکوڕ بیت و بڵێی من ڕاستم من ڕاستم و کەسانی تر هەڵەن ،،نەخێر دەبێ ئەوە باش بزانیت کە هەموو کات ڕاستیەکان لای تۆ نین ،، دەزانن کەسی سەرکەوتوو و شکستخواردوو جیاوازیان چییە ،، یەکێک لە جیاوازییەکانیان ئەوەیە ئەوەیە کەسی سەرکەوتوو هەمیشە خۆی پێ ڕاست نیە ،، کە هەڵەیەکی هەبوو دانیپێدادەنێ و دەڵێ هەڵەم و هەڵەکەشم چاک دەکەمەوە بەڵام کەسی شکستخواردوو نەخێر هەر دەڵێ من من ڕاستم من ڕاستم و کەسانی تر بە هەڵە دادەنێ ،، ئەوە بزانە گەورەی تۆ دەسەلمێنێت کە بڵێی من هەڵە بووم و هیچ عەیبێکی تێدا نیە ...!

# ئامانج.....

ڕۆژەکان جوانتر و جوانتر دەبــن

کاتێ ئامانجێکت هەیە و بۆی دەجەنگــی .....

# هەروا بە ئاسانی.....؟!

هێی تۆ هەر وا بەئاسانی دەتەوێ دەست هەڵگریت  هەروا
بە ئاسانی دەتەوێ بە هۆی شکستێکی بچووکەوە
بوەستی لە گەیشتن بە ئامانج و خەونەکانت ،، هاوڕێ
ژیان تەنیا بریتی نیە لە سەرکەوتن سەرکەوتن
سەرکەوتن ،، بەڵکو شکستیشی تێدایە ئاساییە با
بکەویت شکست بێنێ ئەوە بزانە ڕۆژە سەختەکان
مرۆڤانێکی مەزن بەرهەمدەهێنن

کاتێ تۆ سەردەکەویت وەلێ شکستیش دەهێنێی ،، بۆوا
خۆت لاواز نیشان دەدەی دەی هەڵسەوە و دووبارە دەست
پێبکەوە تۆ مەزنی تۆ بەهێزی ،، هێزێکی گەورە لە
ناخی تۆدا هەیە توانایەکی بێ سنوور لەنێو ناخی تۆیا
هەیە تەنیا گەر کەمێ لەو هێزەی ناخت بەکاربێنی ئەوا
شتانێکی گەورە ئەنجامم دەدەی بڕوات بەخۆت بێ بڕوات
بەخەونەکانت بێ

# ترس.....

ترس له شکست

گەورەترین شکستە......!!!

# حاڵی باش......

هاوڕێ حاڵی باش لە دوو وشـەدا پێناسە دەکـرێ :

هەمیشە ئەو شتەی هەتە شـکور بە ،، بەڵام ڕازی مەبە....!!

# فێربە ....!!!

فێربە کەسە نەرێنییەکان لە ژیانت درەکەی ،، کەسێ کە هانی تۆ نادات ،، کەسێ کە پاڵپشتی و پشتگیری تۆ نیە ،، تۆی خۆش ناوێ هەمیشە حەز بە کەوتنی تۆ دەکات کەوایە دەریکە لە ژیانت و بیسڕەوە ،، گرنگی بەو کەسانە بدە کە هانی تۆ دەدەن ،، کە تۆیان خۆشدەوێ ....

# لێیان گەڕێ با پێبکەنن......!!!!!!

هاوڕێ کەسانێ هەن تەنیا دەیانەوێ شکستی تۆ ببینن بەڵێ بەڵێ ئەمانە لە خزم و هاوڕێ و کەسە نزیکەکانت و کەسانی دەوروبەرت هەن ،، هەر کاتێ تۆ بکەوی ئەوان قاقایان لێوە دێ هەرکاتێ تۆ شکست بێنێ ئەوان پێدەکەنن و دڵخۆشن بە کەوتنی تۆ ..!!

لێیان گەڕێ با بەدڵی خۆیان پێبکەنن ،، ئەسڵەن خۆت نارەحەت مەکە ،، تۆ بەردەوام بە بەردەوام بە لە هەوڵدان ،، بەردەوام بە لەوەی دەستت پێکردووە

باشترین تۆڵەسەندنەوە لەو کەسانەی بە تۆ

پێدەکەنن سەرکەوتنی گەورەیە بۆیە کارێکی وە

بکە  ئەوانەی بەتۆ پێدەکەنن ببنە نائومێدترین

مرۆڤی

سەر زەوی......!!

# خۆت بگۆڕە.....!!!

له هەرێ کارێکدا شکستت هێنا یان له تاقیکردنەوەکەت شکستت هێنا ،، مەڵێ من شکستم هێنا ،، بڵێ ئەمە وەک ئەزموونێ وەرەگرم و ئەمجارە کە خراپ بووم کە لە ڕێگای سەرکەوتن کەوتم دووبارە دەست پێدەکەمەوە ،، گۆڕانکاری لە خۆمدا دەکەم ،، گۆڕانکاری لە پلانەکانی خۆمدا دەکەم بۆ جاری داهاتوو هەوڵدەدەم باشتر بم کەوایە شکستەکانت بەهەند وەرگرە تاکو بتوانی خۆت بگۆڕی هەنێ شکست باشن لە ژیانا چون واتلێدەکەن بەخۆتا بچیتەوە وە سەرنج بدەیت ئایا لە کوێدا هەڵە بوویت تاوەکو خۆت چاک بکەیتەوە...

# له كۆتايدا......

پێویسته له هەوڵدان بیت بۆ ئەو شتەی کە دەتەوێ گرنگ ئەوەیە خۆت بناسی ئامانجت هەبێ خەونت هەبێ بزانیت تۆ کێی بۆچی هاتویتە ئەم دونیایەوە بۆ چ مەبەستێک هاتووی ئەمانە گرنگ هەر مرۆڤێک لەخۆی بکات و لە خۆی بپرسی

من وەک زریان زرار له ڕابردوودا کەسێکی زۆر بێ ئامانج بووم کەسێک بووم خەون و ئامانجم و نەبوو لە بازنەی بێ ئامانجی دەخولامەوە نەمدەزانی بۆچی دەژیم هۆی بونم چییە من لە ڕابردوودا تۆزقاڵێک متمانەم بەخۆم نەبوو هەستی کەساسی و داماوی تەنگی پێهەڵچنیبوم ، بەڵام !!!! توانیم هەم لە ڕووی دەرامەتەوە گەر کەمێکیش بووبێ وە هەم لە ڕووی دەروونییەوە گۆڕانکاریەکی بێ وێنە لە خۆمدا بکەم ....!!! ماوەی ٥ مانگدا من بە بارێکی خراپدا دەڕۆیشتم شکست لە دوای شکست ، قسەی لەخەڵکی لە لایەک ، هاندەرێ نەبوو تاکو هەڵسمەوە لەو بێ هیوای و بێ ئامانجیە دەستم بە کاری هاندان کرد هاندان و بواری گەشەپێدانی خود گۆڕانکارییەکی گەورەی لە ژیانی مندا دروست کرد کە دۆخی منی گۆڕی بە ١٨٠ پلە من نەهاتووم باسی خۆم بکەم و بەخۆمدا هەڵبڵێم بڵێم وام کردوە و وا بووم بەڵکو دەمەوێ بەخۆدا بێنەوە دەمەوێ پێتان بڵێم : چەند بەخێرایی دەتوانیت ژیانت بگۆڕی

تۆ نیگارکێشی سەرەکی ژیانی خودی خۆتیت ، جا بزانیت یاخود نەزانیت...!!!

وە ئەم کتێبەشم بۆیە نووسی ویستم لەو بوارەی کە خۆم کاری تیا دەکەم کە هاندان و گەشەپێدانی مرۆییە گەر سوودێکی کەمیش بێت هەمان بێت بۆ چواردەورەکەمان وە پشت بەخوا ئەمە دەبێتە سەرەتایەک و ان شاءالله لە داهاتوودا

باشتر دەبین ،، سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی هاوکارم بوون لە نووسینی کتێبەکەم دا وە بە شانازیەوە قسە و وتەکانی ئەو کەسانەی کە هەردەم بە مامۆستای خۆمیان دەزانم لە نێو کتێبەکەمدا بەکارم هێناوە بە قسە و وتە جوانەکانیان زیاتر کتێبەکەمیان جوانتر و جوانتر کردووە ئەو مامۆستایانەش :

د.زانا احمد قەساب ڕاهێنەری بواری گەشەپێدانی مرۆیی

م.شکور سلێمان ڕاهێنەری بواری گەشەپێدانی مرۆیی

ئانتۆنیۆ ڕۆبێنز وتاربێژی جیهانی لە بواری گەشەپێدانی مرۆیی

د.عبدالکریم البکارلە بواری گەشەپێدانی مرۆیی

د.ئیبراهیم فەقێ لە بواری گەشەپێدانی مرۆیی

وە بشمبوورن بۆ هەر هەڵە و کەموکووڕییەک گەر لە کتێبەکەدا

هەبووبێ ئێمەش مرۆڤین و هەڵە دەکەین

هیوام باشی هەموو لایەکە و هەمیشە لە لوتکەیا بن......

زریان زرار

24 / 3 / 2020

سێشەممە

.............................................................

”

ئەگەر دەتەوێ جیهان بگۆڕی، ئەگەر دەتەوێ شتێک بگۆڕی
ئەوا سەرەتا لە خۆتێ دەستپێبکە گەر تۆ نەتوانێ
جێگای نوستنەکەت، ژورەکەت، کەلوپەل، جلوبەرگەکانت ڕێکبەخەی
ئەی چۆن دەتوانی جیهان بگۆڕی ئەی چۆن دەتەوێ شتێک بگۆڕی
ئەها هاوڕێ باش بزانە شتە سادەکان کاریگەریان هەیە لەسەرمان
گەر تۆ نەتوانی شتە سادەکان ئەنجام بدەیت
ئەوا ناشتوانی شتە گەورەکان لە ژیاندا ئەنجام بدەیت

“

دیزاینی بەرگ
محمد تحسین لطیف